# بانگەواز بۆ

# ئیسلام

# و ئارامگرتن لەسەری

يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ
بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ
وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ٣١

مامۆستا ئارام خەلەکانی

# بانگەواز بۆ ئیسلام

# و

# ئارامگرتن لەسەری

مامۆستا ئارام خەلەکانی



١٤٤٤هـ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خاتم النبيين محمد وآله وصحبه والتابعين إلى يوم الدين. أما بعد...

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره, ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له, ومن يضلل فلا هادي له, وأشهد ألا إله إلا الله وحده لا شريك له, وأشهد أن محمدا عبده ورسوله صلى الله وسلم عليه وعلى آله وصحبه أجمعين,

فإن خير الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

مامۆستا ئارام فەلەکانی

١٤٤٤هـ

# بانگەواز بۆ ئیسلام

دواکارم لە الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ ئیخلاص و بۆ خۆی بومان پێ بدات لە هەر کارێك ئەنجامی ئەدەین و ناخمان پاك کاتەوە. هەنگاوێك بۆ سەرخستنی ئیسلام ئەوەیش بریتییە لەوەی: پاش ئەوەی خۆمان فێرکرد و شارەزاکرد لە ئیسلام و پاشان منداڵەکانمان و نەوەکانی خۆمان و ماڵ و عائیلەکەمان فێرکرد و فێری دینداریمان کردن. هەر لە منداڵیەوە فێری خواناسین و محمد ناسینمان کردن ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ ئاشنامان کردن به ڕێبازی محمد ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ هەنگاوێکی تر دەست پێدکات ئەویش بریتییە: لە بانگەوازکردن بۆ ڕێبازی محمد ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ ئەگەر ئێمە پەروەردەیەکی ڕاستەقینە کرابێتین و باوەڕێکی جوان لە ناخماندا هەبوبێت وە فێری دینداری بووبین و منداڵەکانمان فێر کردبێ و ئیهمالمان نەکردبن، پاشان خەڵکێکی تر بانگ دەکەین بۆ ڕێبازی محمد ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾. گەورەترین شەرەفە بۆ موسڵمان کە بە ڕێگای پێغەمبەر ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ بڕۆن و ئەو پەیامە بگەیەنن کە رسول الله ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ گەیاندویەتی، گەورەترین شەرەفە خەڵك بۆ خوا بانگ کەیت بۆ لای دینی الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ بانگ کەیت ئەگەر ئێمەی

بڕوادار خەڵك بانگ كەین بۆ دینی خوا خەڵك بانگ كەین بۆ چاكەكاری و خەڵك بانگ كەین بۆ نوێژ و عیبادەت و خەڵك بانگ كەین بۆ تەوحید و خواناسی ئەو كەسانەی كە بانگیان دەكەین هەموویان ئەچنە تەرازوی چاكەكانمانەوە چەند خۆشە ئینسان بگاتەوە بە خوا ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ شەونوێژ و عیبادەتی بۆ نوسرابێ بەڵام لەهەمان كاتدا نەی كردبێ ماندوو نەبووبێت و بەڵام توێشوی پڕ بووبێت بەچی؟ بەوەی كە خەڵكی بانگ كردبێ بۆ دینی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ و خواناسی، هەمومان ئەتوانین وشەگەلێكی جوان بڵێین بەڵام هەمووان ناتوانین فتوا بدەین و هەمووان عالم و زانا نین، بەڵام خۆ هەمووان دەتوانین بە وشە جوانەكانمان خەڵك بانگ كەین بۆ مزگەوت خەڵك بەرەو دینی خوای ڕاستەقینە بەرین بەڵام پێشتر دەبێ هەموویان لە خۆمان جێ بەجێ كردبێ، ناكرێت خۆم لەماڵەوە دۆڕابم و خەڵك بانگ كەم بۆ دینداری و خواناسی، ناكرێت لە خۆمادا كێشەی گەورە هەبێ لە دیندا و بەخەڵك بڵێم وەرە دینداری و خواناسی بكە، ئەبێ خۆمان چاك كەین و ماڵ و منداڵمان چاك كەین و ڕەوشتمان چاك كەین ئینجا هەنگاوی بانگەوازی دینی خوا بنەین، بانگەواز بۆ دینی خوا دەست گرتن بە دینی خوا وە بانگ كردنی خەڵك یەكێك بووە لە ڕەوشتی هەموو پێغەمبەران ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ كاتێ تۆ ئەو بانگەوازە دەكەیت مانای ئەوەیە ڕێگای تەواوی پێغەمبەرانت گرتووە ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ كاتێ تۆ پشتیوانی بانگخوازێكی بەحەق دەكەیت

پشتیوانی مامۆستایەکی بەحەق دەکەیت مانای ئەوەیە تۆ لە ڕێگای ابو بکر و عوسمان و عمر و ابو ئەیوبی ئەنصاری دەڕۆیت. مانای ئەوەیە تۆ حەز دەکەیت دینی خوا سەربکەوێت پێت خۆشە بانگخوازانی حەق لەسەر ڕێگا بمێننەوە و بەردەوام بن و پەیامی خوا بگەیەنن داوێن پاکی بڵاو کەنەوە تەوحید و یەکخواپەرستی بڵاوکەنەوە. دەتوانین ابو بکر بین ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ﴾ وە دەتوانین ابی لەهەبیش بین. ئەتوانین ابو بکر بین ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ﴾ توێشو بین بۆ بانگخوازی دینی خوا. ئەتوانین ابو بکر بین ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ﴾ دەستێکی بەهێز بین بۆ سەرخستنی دینی خوا وە ئەتوانین ابی لەهەب و ابو جەهلیش بین درِك بخەینە سەر ڕێگا و پەیامی خواناسی و دینداری. با هەڵی بژێرین لەم دنیایە لە کامیانین لەوانەین کە دڕك دەخەینە سەر ڕێگای بانگخوازانی حەق یان لەوانەین کە دەستی بانگخوازێك دەگرین و دڵی خۆش دەکەین و قاچی جێگیر دەکەین لەسەر دینداری. وەکو ئەبو بکر ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ﴾ بە پێغەمبەری خوای ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرموو: ئەی محمد من لە پشتم بە ماڵم و بەگیانم و بەسەروەتم. دینی خوا پێویستی بە بانگ کردنە پێویستی بە دەنگی ئێمەیە پێوستی بە هاواری ئێمەیە پێوستی بە تێکۆشانی ئێمەیە کە هاوەڵان و رەسول الله ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ وایان کرد هیچ کاتێك بیرمان کردۆتەوە کەسێك بانگ کەین بۆ مزگەوت هیچ کاتێك بیرمان کردۆتەوە کەسێك کە لە ڕێگا لای داوە دەستی بگرین هیچ کاتێك بیرمان کردۆتەوە لەوەی ئازار بۆ کەسێکی گومڕا لە ناخەوە

بچێژین و بڵێن خۆزگە هیدایەتی وەربگرتایە، یان هەر خەریکی دونیاین خەریکی خۆشیەکانی دونیاین کە هیچیان بەکەڵکمان نایات.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣﴾ (المدثر) هەستە ئەی محمد ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە هەستە خەڵکی بێدار بکەرەوە بانگەواز بۆ دینی خوا بکە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾, لە ئایەتی تر بە پێغەمبەر﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٤٥﴾ (الأحزاب) ئەی محمد ئێمە تۆمان ناردەوە بە شاهید بە موژدەدەر و بە ترسێنەر﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ٤٦ ﴾ (الأحزاب) پێمان وتوویت خەڵك بانگە بۆ لای خوا، نەك بۆلای خۆم نەك بۆلای حیزبەکەم نەك بۆلای شتێکی تر. ببە گڵۆپێکی درەوشاوە ببە خۆرێکی درەوشاوە لە گۆمەڵگادا خەڵك بەرەو خواناسی و دینداری بانگ بکە ڕێگای رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بگرە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٨ ﴾ (یوسف) ئەی محمد بڵێ ئا ئەمە ڕێگای منە بانگ دەکەم بۆ لای خوا لەسەر بەسیرەت و لەسەر

تەوحید و لەسەر دینداری و خواناسی، ڕێگاکە ڕوونە ناکرێ بمان خەڵەتێنن ناکرێ فێڵمان لێ بکەن لەسەر بەسیرەت ڕێگای الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ یەك ڕێگاییە، محمدمان ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ یەك پێغەمبەرە، قورئانمان یەك قورئانە، قیبلەمان یەك دانەیە، ناکرێ سەرمان لێ تێك بدرێت.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ باسمان بۆ دەکات و دەفەرموویت: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ (ال عمران) دەبێ کەسێك هەبێ لە ئێوە سیفەتیان چی بێ ئەی پەروەردگار؟ خەڵکی بانگ بکەن بۆ خێر و چاکە و تەوحید و خواناسی، ئەمر بەچاکە بکەن چاکە ناونیشانێکی گەورەیە لە تەوحیدەوە دەستپێ دەکات و لە بەها بەرزەکانەوە دەردەچێ، وە قەدەغەی خراپەیش بکەن خراپەیش لە شیرکەوە دەست پێ دەکات و تەواوی خراپەکان دەگرێتەوە. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ ئا ئەوانە سەرفرازن ئەو بانگخوازە دیندارە خواناسانە. هەریەکێك لە ئێمە دەتوانین لە ماڵەکانی خۆمان ئەوە بکەین، سیفەتی رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ هەڵبگرین، سیفەتی بانگخوازی رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ هەڵبگرین.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٍ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾ (هود) ناكرێت ئێمە گەلێك لەناو بەرین خەڵكەكەی چاكەكار بن موسڵیح بن. ناكرێت كۆمەڵگەیەك ئایدزی تیا بڵاوبێتەوە زینای تیا نەكرێت. ناكرێت كۆمەڵگایەك پڕ بێت لە دینداری و خواناسی بەڵام نەخۆشیەكی پیسی وەك ئایدزی تیا بڵاوبێتەوە كە هۆكاری زینایە. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموێت:بە هۆی تاوانەكانتانەوەیە كە پشتان كردۆتە دینی خوا.

سوفیانی ثەوری ﴿رَحِمَهُ ٱللَّهُ﴾ دەفەرموویت: (گەورەترین ئینسانەكان لە لای الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ شوێنیان كامەیە؟ كام ئینسانە لای خوا مەنزیلەی زۆر گەورەیە؟ ئەوانەن كە لە نێوان خوا و بەندەكاندان. ئەو كەسانەی كە بەردەوام ئامۆژگار دەكەن و دەڵێن فلان واز لە خراپەكاری بهێنە فلان واز لە زینا بهێنە فلان وەرە بۆ مزگەوت فلان چاكە بكە دەفەرموویت: ئەمانە مرۆڤگەلێكن لە نێوان خوا و بەندە دان. خەڵك بانگ دەكەن بۆلای الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ باسی سیفەتی بڕواداران دەكات دەفەرموویت: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٧١﴾ (التوبة) ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەی حەقن، بڕواداران هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن لەسەر چی یارەب؟ لەسەر ئەوەی ئەمر بەچاکە بکەن ڕێگری لە خراپە بکەن نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن زەکاتەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەکەن ئا ئەوانە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بەزەی خۆیان بۆ دەنێرێت ڕەحمیان پێ دەکات. سیفەتیان چیە؟ سیفەتی بانگخوازیان هەیە خەریکی سەرخستنی دینی خوان، ئەمر بەچاکە دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن نوێژ و عیبادەت و خواناسی دەکەن، هەمان ئاڵای ابو عبیدەیان ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ﴾ بەدەستەوەیە بەڵام ئەمڕۆ بەشێوەیەکی تره هەمان ئاڵاکەی ئەبو بەکریان ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ﴾ بەدەستەوەیە بەڵام ئەمڕۆ بەشێوەیەکی تره. یوسف ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ لە سجنیشدا لەو نارەحەتیشدا وازی لە بانگخوازی نەهێنا بە هاوڕێکانی ئەوت لە سجندا ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ٣٩﴾ (يوسف) خوایەکی تاقانە باشترە یان چەند خوایەك چەند شتێك کە ئێوە گوێڕایەڵیان دەکەن کە الله نین.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ١١٤﴾ (النساء) خێر نیە لە چپەکردن و خێر نیە

له قسه هێنان و بردن خێر نیه له پیلان دانان و خراپەکاری و فەسادکاری لەسەر زەویدا ئەی پەروەردگار خێر لەچیدا هەیە؟ پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ﴾ ئیلا خێر لەوەدا هەیە کە ئەمر بەچاکە بکەیت ئەمر بە بەخشین بکەیت ئەمر بە ئیسلاح بکەیت لەنێوان ئینسانەکاندا، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ١١٤﴾ هەر کەسێك ئا ئەم سیفەتانەی هەبێ ئەمر بە بەخشین و چاکەکاری بکات بە ماعروف بکات خەریکی چاك کردنی نێوانی خەڵك بێ ئەوە پاداشتێکی گەورەی هەیە لای ئێمە ئەو کەسەیە کە بانگەوازی دینی خوا سەردەخات.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادٗا كَبِيرٗا ٥٢﴾ (الفرقان) ئەی محمد گوێڕایەڵی بێ باوەڕان نەکەیت گوێڕایەڵی کافرەکان نەکەیت لەگەڵیان بە جیهادێکی گەورە بجەنگێ، چیە ئەو جیهادە؟ ئەویش بانگەوازکردنە بۆ دینی خوا، پەیامی خوا بگەیەنین، بەڵام بەداخەوە ئێستا بە خۆمان نەگەیشتووە چۆن بیگەیەنین بەخەڵکی تر؟ ئەگەر بێ باوەڕێك بیەوێت موسڵمان بێ بێتە ناو کۆمەڵگای موسڵمانان سەیری ڕیزی موسڵمانان بکات سەیری زمانی موسڵمانان بکات لە پاکی و پیسیدا وە ئیسلامیش بخوێنێتەوە دەڵێ واللە هی ئێوە لە دۆڵێکن و

ئیسلامیش لە دۆڵێکی ترە. بەرهەمی بانگخوازی و دینداری بەرهەمێکی گەورەیە پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ لە جەنگی خەیبەردا فەرمووی: (أن رسول الله ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ قال يوم خيبر: لأعطين الراية غدا رجلا يحب الله ورسوله ويحبه الله ورسوله، يفتح الله على يديه، فبات الناس يدوكون ليلتهم أيهم يعطاها فلما أصبحوا غدوا على رسول الله ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ كلهم يرجو أن يعطاها، فقال: أين علي بن أبي طالب فقيل: هو يشتكي عينيه. فأرسلوا إليه فأتي به، فبصق في عينيه ودعا له فبرأ كأن لم يكن به وجع، فأعطاه الراية فقال: انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادعهم إلى الإسلام، وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله تعالى فيه، فوالله لأن يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم.) بەیانی ئەم ئاڵایە ئەدەمە دەستی کەسێك خەیبر لەسەر دەستی ئەو فەتح دەبێ ئەو خوا و پێغەمبەری خوای ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ خۆش ئەوێت خوا و پێغەمبەری خوایش ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ ئەویان خۆش دەوێ هەر هاوەڵەو ئومێدەوار بوو کە ئەو بێ هەموویان ئومێدیان دەخواست. عومەری کوڕی خەتاب ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ﴾ دەفەرمووێت: هیچ کاتێك حەزم بە ئومێدەواری نەکردوە ئیلا ئەو کاتە نەبێ. بەیانی بووەوە پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی: کوا علی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ چاوەکانی ئازاری هەیە فەرمووی: بینێرن بۆلام هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾

هەندێك لە تفی موبارەكەی خستە چاوەكانی ئاو بە چاویدا هاتە خوارەوە دوعای بۆ كرد چاوەكانی چاك بوو ئیمامی علی ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ﴾ دەفەرمووێت: هەتا وا هەستم دەكرد ئەو چاوانەم هەر ئازاری نەبووە، ئیمامی علی ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ﴾ ئاڵاكەی گرتە دەست و ڕۆی فەرمووی: یا رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ بجەنگیین لە گەڵیان تا وەك ئێمەیان لێ دێت رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی: هێواش بڕۆ ئەی علی بڕۆ مەیدان بۆیان پێیان بڵێ: حەقی خوا چیە لەسەرتان؟ هەموویان بۆ ڕوون بكەرەوە، ئەوەی ئامانجی قسەكانی ئێمەیە ئەم وشەیەی پێغەمبەری خوایە ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی:( فوالله لأن يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم.) سوێند بە الله ئەگەر یەك كەس لە سەر دەستی تۆ هیدایەت وەربگرێ بۆ تۆ لە گرینگترین شتەكانە ئەی علی، لە حوشترێكی گران بەها باشترە.

كەواتە ئەگەر كەسێكی موسڵمان لە سەر دەستی كەسێك هیدایەت وەربگرێ باشترە بۆی لەشتە گرینگەكانی دونیا. بەڵام ئێمە لێی بێ ئاگاین. ئیمام حسن بصری ﴿رَحِمَهُ ٱللَّهُ﴾ دەفەرمووێت: (ئیسلام دێت لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر شێوەی ئینسانێك دێت بۆلای بڕواداران دەڵێ یارەب ئا ئەوە سەری خستم ئا ئەوەیش توشی شكستی كردم ئا ئەوە پشتی تێ كردم ئا ئەوە خۆی بە موسڵمان دەزانی بەڵام سەری نەخستم ئا ئەوەیش خوێن و ماڵ و تەمەنی سەرف كرد بۆ سەرخستنی ئیسلام و دینداری) چەند

خۆشە ئینسان وا بانگ بکرێت الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ داوامان لێ دەکات دعوە و بانگەوازی حەق بکەین بۆ لای الله. نوح ئاسا ﴿عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ﴾ کە فەرمووی:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ٥ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ٦﴾

(نوح) خوایە شەو و ڕۆژ بانگی قەومەکەمم کرد بەڵام وەڵامیان نەدامەوە و ڕایان دەکرد لێم و پشتیان تێ ئەکردم. ئەبێ لە نوحەوە ﴿عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ﴾ ئەو نەفەسە بەهێزە وەربگرین کە سارد نەبینەوە لە بانگەواز و دعوە و خواناسیمان.

پەروەردگار ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥﴾ (النحل) ئەی محمد خەڵك بانگ کە بۆ ڕێگای خواناسی و ڕێگای حەق لەسەر ڕێبازەکەی خۆت بە دانای خۆت بە وشە جوانەکانت موناقەشەیان لەگەڵدا بکە تۆ زۆر لە سەرووی ئەوانەوە بە. با قسەی ناشرینت پێ بڵێن با بوهتانت بۆ بکەن با قسەی نەشیاوت پێ بڵێن خوای تۆ ئاگادارە کێ لای داوە لە ڕێگاکەی کێ لای داوە لە ڕێبازەکەی الله شارەزایە کێ لەسەر هیدایەتە و زانایە. ئێمە ناتوانین الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ بخەڵەتێنین بە هیچ شتێك نە بە شێوە نە بە مێزەر نە بە ڕیشمان نە بە وشە و زمانی لوسمان. الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ ئاگەداری ناخ و نیەتمانە.

اللهﷻ له قورئاندا باسی ئەو کەسانەی کردوە با پێغەمبەریش نەبن مادام خەڵکیان بانگ کردبێ بۆ دینداری و خواناسی بۆ حەق با گیاندایش بووبن لەبەر فەزڵ و گەورەییان لە قورئاندا باس کراون، الله ﷻ دەفەرمووێت: ﴿وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٢٠ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٢١﴾ (يس) پیاوێك هات لە ناوراستی شارەوە هاواری لە خەڵکەکە کرد وتی ئەی خەڵکینە شوێن پێغەمبەران بکەون شوێن ئەوانە بکەن کە داوای هیچتان لێ ناکات ئەوانە هیدایەت دراون. ئەها الله ﷻ باسیان دەکات لە قورئاندا. باسی هود هود دەکات کە شارێك بە هۆیەوە موسڵمان بوو باسی گەورەی دەکات با گیانداریش بێت هۆکاری هیدایەتی شارێك بوو بەناوی سبأ کە گەورە و بچوکیان موسڵمان بوون. الله ﷻباسی مێرووله دەکات بۆ؟ چونکە ڕێگە نیشاندا و ڕێگە نیشاندەری خەڵك بوون و خۆیان بوون، وەك الله ﷻ لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٨﴾ (النمل) هەتا سولێیمان نزیك بووە وە لەو شوێنەی مێرووڵەکانی لێ بوو یەکێك لە مێرووڵەکان وتی: ئەی مێرووڵەکان بچنەوە ماڵەکانی خۆتان با جوندێکانی سولێیمان پانتان نەکەنەوە ئەوان ئاگایان لە ئێوە نیە. الله ﷻ ئەو ئایەتەی لە قورئاندا باسکردوە چەندین

ئیعجازی بۆ ئێمە تێدایە هۆکارەکەی چی بوو؟ ئەم مێرووله چی کرد؟ بانگی مێروولەکانی خۆی کرد بۆ ئەوەی توشی بە هیلاك چوون نەبن.

دەبێ ئێمەیش هەموو بانگخوازان بانگی قەومەکانمان بکەین وەکو هود هود و وەك ئەو پیاوەی کە لە ناوراستی شاردا بانگی کرد وەکو ئەو مێروولەیە ئەڵێین: ئەی قەومەکەمان وەرن ڕێگای خوا بگرن با بەهیلاك نەچین وەرن با بچینە ناو کەشتی نەجاتە و کەشتی ئیسلامەوە بە غەرق نەبین و تیا نەچین فەسادی و خراپەکاری دەوری داوین وەرن با لێ دووربکەوینەوە بەختەوەری و سەربەرزی بۆ ئەوانەی وەڵام دەدەنەوە. کەوابوو با ئاگەداربین.

پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرمووێت:(من دل على خير فله أجر فاعله) هەر کەسێك ڕێنیشاندەری کەسێکی تر بێ بۆ چاکە بە قەد چاکە ئەوەی بۆ دەنوسرێت.

وەك ئەم مژدە گەورەییەی کە رسول الله ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەمووێت:( نضر الله امرأ سمع مقالتي فوعاها وحفظها وبلغها، فرب حامل فقه إلى من هو أفقه منه) دەم و چاوی کەسێك گەشاوە و جوان بێ بەختەوەری دونیا و قیامەت بێ گوێی لە قسەیەکی من و گوێی لە وتەیەکی من بێ لێی تێ ئەگات پاشان ئەگەیەنێت وەکو ئەوەی کە بەجوانی لێی تێ گەیشتووە.

کەواتە ئێمەی موسڵمان با لە ناخەوە لە بیروباوەڕمانەوە ئاڵای ئیسلام بەرزکەینەوە بانگەوازی بۆ بکەین با لە ماڵەکانی خۆمانەوە و لە دەرەوە و لە دراوسێکانمانەوە بە وشەی جوان بە ئەخلاقی بەرز، زۆرجار بانگەواز دەکرێت بەبێ وشە بەبێ قسە بەبێ دەنگی ئەویش بە ڕەوشت دەبێ، لەسەردەمی ئیسلامدا کاتی کە خیلافەتی ئیسلام هەبوو ئیسلام باڵا دەست بوو ناوچەی وا هەبووە موسڵمانی زۆری لێ بووە وەك ئەندەنوس کە ئیسپانییای ئێستایە یەك جوندی موسڵمانان نە چووەتە ناوی هێز و قوەت و خیلافەتی موسڵمانان نەچووەتە ناوی تەنها بازرگانەکانمان بە ڕەوشتی جوان و بەرز موسڵمانیان کردن.

الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ٣٣ ﴾ (فصلت) کێ قسەی لەوە جوانترە کێ وشەی لەوە بەرزترە کە ئەڵێت: ﴿مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسەی کە خەڵك بانگ دەکات بۆلای خوا بە کردەوەی چاکە دەڵێ من موسڵمانم من دیندارم خەڵکینە ئێوەیش وەرن شوێن ڕێبازی محمد ﴿صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ﴾ بکەون خەڵکینە وەرن ئێوەیش قەبرەکانتان ڕووناك بکەنەوە خەڵکینە ئێوەیش وەرن قیامەتان ڕووناك بکەنەوە خەڵکینە ئێوەیش وەرن خۆتان لە عەزابی قەبر بپارێزن کێ وشەکانی لەوە جوانترە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ١٣ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ١٤﴾ (الطارق) بەراستی پەیامەکانی ئێمە وەعدەکانی ئێمە وەك وەعدی ڕاستەقینەن گاڵتەو گەپ نین گاڵتەجاری خەڵك نیە قسەکانی ئێمە ڕۆژێك دێت چۆن مردن ئەچێژن حەق و حیسابیش ئەچێژن و لێتان ئەپرسرێتەوە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩﴾ (البقرة) ئەوانەی دەی شارنەوە ئەوەی کە ئێمە دامان بەزاندوە نای گەیەنن. ڕێبازەی محمد کە هێناویەتی ئەی شارنەوە ئەوانە خوا نەفرەتیان لێ دەکات و نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لێ دەکات پەیامی خوا ناگەیەنن پەیامی خوا ئەشارنەوە لە پێناوی بەرژەوەندی سیاسی خۆیان دینی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ناگەیەنێ خەڵك هەڵ ئەخەڵەتێنێ. پەیامی تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ و کەناڵەکان بە گوێی خەڵکدا ئەدا ئایەتەکانی اللهی واز لێ هێناوە.

با بۆ الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ کار بکەین لە پێناوی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ کار بکەین بۆ ئەوەی دینی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ سەرکەوێت ئەو کاتە ئامانجەکەمان ئامانجێکی گەورەیە و گەشتنە بە بەها بەرزەکان بۆ ئەوەی ئیسلام بەرز کەینەوە بۆ ئەوەی ئاڵای رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بەرزکەینەوە ئەو ئاڵایەی کە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بەدەستی موبارەکی خۆی ئەو

ئاڵاییەی بەرزکردەوە ئەو ئاڵایەی کە جەعفەر ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ﴾ بەرزی کردەوە دەستیان قرتان و دەستەکەی تریشیان قرتان پاشان خستیە نێوان سینگی هەموو گیانی خوێنی لێ ئەچۆرا بەڵام ئاڵاکەی بەر نەئەدا با ئەو ئاڵایە بەرز کەینەوە ئەگەر ئێمە بانگەواز بۆ دینی خوای پەروەردگار نەکەین واللە هی خەڵکانێك هەن شەو و ڕۆژ خەریکن دینی بێ باوەڕی سەر ئەخەن خەریکی خراپەکارین ساڵانە لە فاتیکان پاپاکانی مەسیحێکان ملیار ملیار دۆلار سەرف ئەکەن بۆ ئەوەی خەڵك بانگ کەن بۆ دینی مەسیحییەت ئێمە بێ ئاگاین لەم شتانە ئێمە وازمان لەم دینە هێناوە لەو ئاڵای محمد هێناوە کە هەڵی گرتووە.

خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤﴾ (مریم) ئێمە باسی ئیسماعیلتان بۆ دەکەین کەسێکی ڕاستگۆ بووە لە وەعدا ئەی پەروەردگار سیفەتی ئەو پێغەمبەرە ﴿عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ﴾ چی بووە؟ ئاوا تۆ وەسفی دەکەیت ﴿وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ٥٥﴾ (مریم) فەرمانی بە ئەهلەکەی ئەکرد بانگەوازی ئەکرد بۆ لای اللە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ کە نوێژ بکەن زەکات بدەن لای اللە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ کەسێکی ڕێز لێگیراوە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ٤٥﴾ (ق) ئەی محمد ئێمە ئاگامان لێییەتی کە چی ئەڵێن بەڵام تۆ توانات نیە بەسەریاندا بیان ترسێنە بە قورئان ئەوانەی کە دڵیان هەبێ ئەترسن ئەوانەی دڵیان لای الله بێ پەشیمان ئەبنەوە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥﴾ (الذاريات) بەبیریان بهێنەوە چونکە بیرهێنانەوە سوود ئەگەیەنێ بە باوەڕداران، هەمیشە بانگخوازی بە حەق بۆ بەرزکرنەوەی ئاڵای ئیسلام سەرخستنی ڕێبازی محمد ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ تێ ئەکۆشێت.

ابن القيم الجوزی ﴿رَحِمَهُ ٱللَّهُ﴾ دەفەرمووێت: (کەسێك نابێتە شوێنکەوتووی محمد ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بەراستی هەتا بانگ نەکات بۆ ئەوەی محمد ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بانگی بۆ کرد لەسەر حەق و چاوڕوونی لەسەر خواناسی و تەوحید). کەواتە بادینی محمد ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ سەربخەین پەیامی رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ سەربخەین ئەگەر بەوشەیەکیش بێ، بێ ئاگایمان لە دینی خوا هەرخەریك بووغان بە دونیاوە خەم نەخواردنی قەبرمان ئەو قەبری کە ماڵی ڕاستەقینەی ئێمەیە. ئەو قیامەتەی کە لە پێشمانە ئەو ئیسلامەی کە لەسەر شانی ئێمەیە بگەیەنین، کەی هاوەڵان

وابوون کەی صالّحین وابوون کەی پیاوچاکانی پێش ئێمە وابوون سوێند بە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ئەگەر وابوونایە ئیسلام بە ئێمە نەدەگەیشت ئیسلام لە شارێکیشدا بڵاو نەدەبوو وەوە.



# ئارامگرتن لەسەری

داواکارین لە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ئیخلاص و بۆ خۆی بونمان پێ بدات لە هەر قسەیەك لە هەر وشەیەك كە دەیڵێین لە هەر نیەتێك كە لەناخماندایە. یەكێك لە پێویستێكانی سەرخستنی ئیسلام بریتییە: لە ئارامگرتن. بە ئارامگرتن ئەتوانین دینكەمان سەربخەین ئەو دینەی كە ئێمە هەڵمانگرتووە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە چونكە ڕێگاكەی دیارە ڕێگاكەی ڕێگای پێغەمبەرانە ﴿عَلَيْهِمُ السَّلَامُ﴾ ڕێگاكەی هەمووی ئازار و نارەحەتی و خەم و دابڕان و ناخۆشییە هەر یەكێك لە ئێمە ئەگەر بیەوێت هەنگاوی ڕاستەقینە بنێ بەرەو خوا بەرز بێتەوە بەرەو خوا بڕوات ڕەوشتی بەرز بێ دینداری ڕاستەقینە بكات خواناسی ڕاستەقینە بكات بەتائكید لەم ڕێگایەدا توشی ئەستەم و نارەحەتی دەبێت بۆمان دەردەكەوێت كە ڕێبوارانی ڕێگای حەق لە شوێنی گەرمدا نین ڕێبوارانی ڕێگای حەق توشی غەم و نارەحەتی و فرمێسك ڕشتن و ئازار دەبن ئەوە ڕێگەی پێغەمبەرانە ﴿عَلَيْهِمُ السَّلَامُ﴾ ئەتوانین لە نوحەوە ﴿عَلَيْهِ السَّلَامُ﴾ پێیدا بین و سیرەتیان بخوێنینەوە هەتا ئەگاتە پێغەمبەر محمد ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾، با بزانین نوێنەرەكانی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾و پەیامبەرەكانی خوا لەسەر زەوی چۆن ژیاون؟ وەك ئێمە نەبوون بۆ؟ چونكە ئەوان هەم و غەمیان

سەرکەوتنی دینی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بووە ڕێگەبڕین بۆ سەرکەوتنی دینی خوا هەمووی ئازار و فرمێسك ڕشتنە. بەهەشت ڕێگاکەی دڕك و داڵە بەهەشت ڕێگاکەی ئازار و ژانە نارەحەتیەکانی ژیانە. ئەوە دۆزەخە چوار دەوری شەهەواتە ئەوە دۆزەخە خۆشییەکانە ئەوە دۆزەخە چەپلە و گۆرانی و پێکەنینەکانە. رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ وا دەفەرموویت:( حفت الجنة بالمكاره وحفت النار بالشهوات) بەهەشت دەورە دراوە بە نارەحەتیەکان وە ئاگریش بە خۆشیکان دەورە دراوە. فەرموو فەرموو و پێکەنین و یاری و گەڵتەیە خواردن و سەرخۆش بوون جێ بەجێ نەکردنی فەرمانی الله یە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ تێك شکاندنی سنووری الله یە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾.

کەواتە پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە بۆ سەرخستنی دینەکەمان بۆ سەرخستنی ئەقیدەکەمان هەتا لە خۆمانیشدا. ئەمڕۆ ئەگەر ڕێبازی ئیسلام بگریت و سنوورەکان نەشکێنیت ئەوا خەڵکانێك هەن بە چاوێکی تر سەیرت دەکەن دەڵێن دواکەوتووە دەڵێن هیچ نازانێ لەسەردەمی چەرخی بەردیندا دەژێ لە کۆمەڵگا دابڕاوە لە ژیان دابڕاوە. هەموو هەنگاوەکانی ژیان پێویستی بە ئارامگرتن هەیە بۆ سەرخستنی ئیسلام و دینی خوا بانگەواز دەکەی دەبێ ئارام بگری ڕێگاکە هەمووی دڕك و داڵە هیچ ساتێك ناڕوات بەسەر تەمەنتدا دڕێك نەچەقێت بە قاچدا کەس تانەت لێ نەدا و ئازار نەدریت جنێوت پێ نەدرێت. ئەوە ڕێگای

بانگەوازی پێغەمبەران ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ بووە. کەواتە لە هەموو شوێنێك ئەتەوێت ڕەوشتت بەرز بێ بێگومان ئازار دەدرێیت قسەت پێ دەوترێت ئەگەر بتەوێت ڕەوشتە بەرزەکە هەڵبژێریت ئەبێ ئارام بگریت ئەبێ زاڵبیت بەسەر توڕەبوونتا ئەبێ زاڵ بیت بەسەر شەهەواتت دا. کەواتە بۆ سەرخستنی دینی خوا پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە بەڵام ئێمە ئارام ناگرین تەنانەت لەسەر حەرامەکانی دونیاش لە هەر شوێنێك هاوراێك پەیامێکی ناحەق ببیستین ئاوڕی لێ دەدەینەوە توانامان نیە خۆمانی لێ دووربخەینەوە. کە یەقینت هەیە بە بیروباوەڕەکەت کە یەقینت هەیە بە محمدەکەت ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ کە یەقینت هەیە بە ئیسلامەکەت. نابێ وەڵامی هیچ بانگەوازێکی تر بدەیتەوە نابێ ئاوڕیشی لێ بدەیتەوە. ئەوە ئێمەین لە جەژنە جاهیلێکاندا شوێنیان ئەکەوین دەبینین کاتێ سەری ساڵی زاینی دێت خەڵکانێك چۆن بەشداری دەکات دەبینین ئەهلی مزگەوتە عیدمیلاد بۆ منداڵەکەی دەکات ئەم بۆنەیەت لە کوێ هێنا؟ کێ پێی وتیت؟ شوێن کەوتووی کێیە؟ ئەمە عیدوحوبە بۆ کافرەکان شوێنکەوتنی جەهیلیەتە. ئارام ناگرین کە دژاییەتی ئەم جاهیلێتە بکەین. بۆ ئەوەی بگەین بە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بە دڵێکی پاك بە موحیدی بە خواناسیەکی ڕاستەقینە پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٢٤٩﴾ (البقرة) ئەگەرئێوە ئارام بگرن

با دەستەیەکی کەمیش بن سەردەکەون و زاڵ دەبن بەڵام بە مەرجێك سابرِ و ئارامبگرن. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ لەگەڵ سابرِاندایە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ پێمان دەفەرمووێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦﴾ (الأنفال) گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خوا بن ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ واز لە جیاوازی بهێنن لە نێوانی یەکتردا ئەگەر وانەبن عیزەتان نامێنێت هێزتان نامێنێت پارچە پارچە دەبن ئارام بگرن خۆتان توشی ئەو بەڵایە مەکەن الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ لەگەڵ ئارامگراندایە. هەر کاتێك ئارامت گرت لەبەر الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ سەیری ئاسمانت کرد دڵت پەیوەست بوو ئەوا یارمەتی الله ت ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بۆ دادەبەزێت ئارامت پێ دەدات دڵخۆشیت پێ ئەدا.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾ (البقرة) ئێمە لێتان ناگەڕێین تەنها ئەوەندە بڵێن ئیمانمان هێناوە تاقیتان نەکەینەوە. زەرەنگەرێك تاوەك زێرەکەی لە زاخاو نەدات پارە ناکات بەکەڵك نایەت. دەبێ موسڵمان تاقی بکرێتەوە لە بێژنگ بدرێت ئێوە دەتان ئەوێت بچنە بەهەشتە پێش ئەوەی وەك ئەوانەی پێش خۆتان تاقی بکرێنەوە

ناچن هەتا تاقی نەکرێنەوە، الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویێت:﴿مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ ﴾ توشی نارەحەتی و غەم و پەژارە و فرمێسك و ژانی دڵ دەبن توشی نارەحەتی سەخت دەبن ڕائەچەڵەکێن، ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾ هەتا وایان لێ دێت پێغەمبەرەکەیان داوای سەرکەوتن دەکات لە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾، الله یش ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ پێی دەفەرموویێت: سەرکەوتن نزیکە لە ئێوە.

کەواتە پێغەمبەران ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ تاقی دەکرێنەوە ساڵحین تاقی دەکرێنەوە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ تاقی دەکرێنەوە. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویێت: ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾ (البقرة) ئارامگران لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا ئارام دەگرن لەسەر ئازارەکانی ژیان پەلاماری حەرام نادەن پەلاماری ڕێگەیەی دوور لە دین نادەن بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی ڕێگە خراپەکە هەڵنابژێرێت، بەراستی سەرکەوتنە کەسێك دان بە خۆیدا بگرێت بۆ پاروویەکی حەڵاڵ واز لە هەزاران پارووی حەرام بهێنێت ئەوە سەرکەوتنە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویێت: ئەوانە موتەقین.

ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەران ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ بکەین ئەوان چۆن تاقی کراونەتەوە چۆن ئارامیان گرتووە ڕێگەی سەرکەوتن گوڵزار نیە باخ

و بێستان نیە ڕێگەی سەرکەوتن ئازارەکانن فرمێسکەکانن ئازاری دڵ و ناخۆشییەکانی ژیانن، نوح ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ (٩٥٠) ساڵ ئازاری چەشت هاوار لە قەومەکەی دەکات بانگیان دەکات بەڵام دەبینین ئارامیش دەگرێت لەسەر ئەو ڕێگایە، ئەوە ئیبراهیمە ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ ئاگری بۆ ساز دەکرێت ئەخرێتە ناو ئاگرەکەوە ئاگرەکە هەڵدەبژێرێت، ئەوە زەکەریایە ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ بە موشار لەت ئەکرێت، ئەوە یەحیایە ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ سەردەبڕێت، ئەمانە کێن؟ ئەمانە پێغەمبەران و خۆشەویستانی الله ن ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ کەواتە ڕێگاکە سەختە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە هەر کاتێك ئەتەوێت تاوانێك نەکەی حەرامێك نەخۆیت فەسادێك نەکەی دەبێت ئارامبگریت. ئەوە یوسفە ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ بوهتانی بۆ دەکرێت، ئەوە عیسایە ﴿عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ﴾ ئازار دەدرێت ئەیانەوێت بیکوژن و لەناوی بەرن، ئەوە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ لە ڕێگە و شوێن و ماڵ و حاڵی دەرئەکرێت رسول الله یان ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەرکرد برسیان کرد چواردەوریان دا کاتێك لە سوجدەیا بوو ڕیخۆڵەی حوشتر و پاشماوەی حوشتریان خستە سەر شانەکانی.

کەواتە ڕێگاکە پڕ لە ئازارە پێویستی بە ئارامگرتن و سەبرِ هەیە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ لە تائیف بەرد باران ئەکرێت خوێن بە دەم و چاوی موبارەکی دێتە خوارەوە لەهەمان کاتیشدا خۆشەویسترین بەندەی

خوایە. دەی کەوابوو ڕێگاکە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە لەم ڕێگەیەدا نارەحەتی هەیە ئەوانەی داوای سەرکەوتنی ئیسلام دەکەن بەڵام لە هەمان کاتیشدا خەوتون و پاڵیان داداوە و بێ ئازارن ڕاست ناکەن چونکە ژیانی پێغەمبەرانیان ﴿عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ﴾ نەخوێندۆتەوە وە ژیانی رسول الله ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ نەخوێندۆتەوە وە ژیانی هاوەڵانیان ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ نەخوێندۆتەوە.

ئەوە ئەبو بکرە ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ﴾ ئازار دەدرێت بەهۆی ئازاردانەکە لە هۆش خۆی دەچێ کاتێك بە هۆش هاتەوە وتی: رسول الله ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ وەزعی باشە؟ پێغەمبەرەکەمان ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ چۆنە؟ ئەوانە بوون ڕێبوارانی ڕێگەی ئیسلام و ڕێبوارانی ڕێگەی سەرخستنی ئیسلام، ئەوە عوسمانە ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ﴾ کەسایەتییەکی گەورە بوو لە ناو قورەیش بەڵام کاتێك کە باوەڕ دەهێنێت هەڵی دەواسن لەلایەن مامەیەوە هەڵدەواسرێت دووکەڵی بۆ دروست دەکەن دەم و چاوی ڕەش دەبێ لە ژێریەوە ئاگرو دوکەڵە لە حەسیر پێچراوە. ڕێگاکە وایە کەواتە پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە. عەماری کوڕی یاسر ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ﴾ گرتیان لێیاندا ئازاریاندا ئازارەکە گەیشتە ئەوەی وتیان ئەبێ جنێو بدەیت بە محمد بە نارەحەتی جنێویدا بە رسول الله ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ هاتە خزمەت رسول الله ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی: (شر يا رسول الله، ما تركت حتى نلت منك،

وذكرت آلهتهم بخير قال: كيف تجد قلبك، قال: مطمئناً بالإيمان، قال: إن عادوا فعد) یارسول الله وام وت پێت دەسەڵاتم نەبوو پێغەمبەر ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی:دڵت چۆنە ئەی عمار؟ فەرمووی: دڵم پڕ لە ئیمانە دڵم پڕ لە خۆشەویستی تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بەڵام ئازار درام نارەحەتیەکی زۆرم بەسەردا هات بۆیە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی: ئەگەر جارێکی تریش ئازاریان دایت و زۆریان لێ کردیت کە جنێو بدەیت جنێوم پێ بدە.

ئەوە یاسریشە ئازار ئەدرێت ڕیشی سپییەو دەستەکانی ئەلەرزێ و دەم و چاوی لۆچ بووە لە ژێر پێیەکانی کافرەکانی قورەیشدایە کە رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ بەلایدا دەڕوات کاتێك چاوەکانی هەڵدەبڕێت پێغەمبەر ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ دەبینێ دەفەرمووێت: (يا رسول الله الدهر هكذا؟ فقال له النبي ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ اصبر) لە ژیانمدا ئازاری وام نەبینیوە ئەی پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ پێغەمبەر فەرمووی: ئارام بگرە. ئەوان ئاوا ئارامیان دەگرت. ئەمە ئازارەکانی ڕێگایە نایەیت بۆ نوێژی بەیانی بە تەمای بەهەشتیت نایەیت بۆ مزگەوت و ڕووت لە خوانیە خەریکی خراپەکاریت و پێت وایە بە هەشت بە ئاسانی بە دەست دێت. هاوەڵەکانی رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ ئەوان بەراستی داوای بەهەشتیان دەکرد داوای خواناسیان دەکرد.

ئەوە سومییەی دایکی عمارە ئەبو جەهل بەسەرییەوە وەستاوە حەربێکی بەدەستەوەیە دەیکات بە فەرجیدا ئەیکوژێت و شەهیدی دەکات بەڵام ئارامی گرت خۆ دەیتوانی بە وشەیەك خۆی ڕزگار بکات پەشیمان بێتەوە. ئەوان ڕێگەی بەهەشتیان هەڵبژارد بێگومان ڕێگەی بەهەشتیش درِك و داڵە.

ئەوە بیلالە لە گەرمای هاویندا لە گەرمای مەككە دا نارِەحەت كرا ئازار درا بەڵام هەر دەی وت: (أحد أحد) تەسلیم نابێ دەڵێت: والله هی بزانیایە وشەیەكی تر هەیە ئازار بە ئومەیە و كافرەكان دەگەیەنێت لە أحد بەولاوە دەم وت ئەم زانی ئەم وشەیە زۆر ئازاریان پێ دەدات كە ئەڵێم: أحد الله تاقانەیە. تەوحید سەرچاوەی هەموو بەختەوەرییەكانی ژیانی ئینسانە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل) ئێمە پاداشتی ئەوانە ئەدەینەوە كە ئارامیان گرت بە پاداشتێك كە لای خۆمانە بە هۆی ئەو كارانەی كە ئەنجامیان داوە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت:﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ (ال عمران) ئاوا ئەچنە بەهەشتەوە؟ هەتا الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ تاقیتان نەكاتەوە بۆ ئەوەی زوبانتان بگیرێت لە قیامەتدا چونكە مرۆڤ بۆ هێنانەوەی بیانو دەمی درێژە ئەم

بەخشی نوێژم دەکرد ڕۆژووم دەگرت جیهادم دەکرد کاری چاکەم دەکرد. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ هەریەکمان بە شێوەیەك تاقی دەکاتەوە بە شوەیەکی ژیانی خۆت دەرئەچی یان دەرناچی تەنها ئارامگران دەرئەچن.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت:﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ٢﴾ (العنكبوت) خەڵکی واحساب دەکەن کە هەر وتیان ئیمانمان هێناوە تاقی ناکرێنەوە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ٣﴾ (العنكبوت) ئەوانەی پێش ئێوەمان تاقی کردۆتەوە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ڕاستگۆ و ناڕاستگۆکانی دەرخست.

کێ ئەتوانی لەم فیتنەی ئەم زەمانەدا دەست بە دینی خواوە بگرێت کێ لە ئێمە دەتوانێ لەم فیتنەیەدا کە تاریکای سەر زەوی گرتووە دەست بە دینی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ و تەوحیدەکەیەوە بگرێت الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ نەدۆڕێنێت دینەکەی نەدۆڕێنێت بۆ دونیا بۆ پارە بۆ دەسەڵات بۆ ژیان. رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ لە لای کەعبە دانیشتبوو (شكونا إلى رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ وهو متوسد بردة له في ظل الكعبة، قلنا له: ألا تستنصر لنا؟ ألا تدعو الله لنا؟ قال: كان الرجل فيمن قبلكم يحفر له في الأرض، فيجعل فيه، فيجاء بالمنشار فيوضع على رأسه فيشق باثنتين، وما يصده ذلك عن دينه،

ويمشط بأمشاط الحديد ما دون لحمه من عظم أو عصب، وما يصده ذلك عن دينه ، والله ليتمن هذا الأمر، حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضرموت، لا يخاف إلا الله، أو الذئب على غنمه، ولكنكم تستعجلون) خەباب دێت بۆ لای رسول الله ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ پشتی بۆ هەڵئەکات هەموو پشتی سووتاوە هەموو گیانی سووتاوە هەموو گیانی بە ئازارە هەموو گیانی برینە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعامان بۆ ناکەیت الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ سەرمان بخات پێغەمبەر ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرمووێت: ئەی خەباب وەرە پێشەوە با پێت بڵێم ئومەتانی پێش ئێمە چۆن تاقی کراونەتەوە ئێمەیش لە ڕێگای ئەوانەوە ئەڕۆین خەڵکانێك هەبوو لە پێش ئێمەدا ئیماندار بوون بە شانەی ئاسن گۆشتیان لێ ئەکرایەوە هەتا گۆشت و ئێسقانیان بەیەکەوە جیا ئەکردەوە بە مونشار لەتیان ئەکردن بەڵێ ئەوان پاشگەز نەئەبوونەوە. کەوابوو پێغەمبەری خوا ﴿صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ بە خەباب و ئێمە ئەڵێ ڕێگاکە سەختە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە هەر زەمەنەو پێویستی بە جۆرێك لە ئارامگرتن هەیە. لە بانگەوازدایت پێویستە ئارام بگریت لە جیهاد دایت پێویستە ئارام بگریت لە هەر شوێنکدایت پێویستە ئارام بگریت ئەتەوێت خەڵك بەرە و ئیسلام و مزگەوت بهێنیت ڕێگاکەی نارەحەتە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾﴾ (ال عمران) ئەگەر ئێوە ئارام بگرن لە خوا

بترسن فێڵ و پیلانی دوژمنان زیانتان پێ ناگەیەنێت. با هەر خەڵك قسە بکات قسەکانی ئەخەمە ژێر پێم من شەرعی الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ ڕێبازمە من پەیامی خوا ناونیشانمە چۆن گوێ بۆ قسەی خەڵکی دوورلە دین ئەگرم چۆن شوێن ڕێبازی جولەکە و یەهود و نەسارە ئەگرم چۆن شوێن خراپەکاری و فەساد ئەکەوم. الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ١٢٠ ﴾ من تەواو ئاگەداری کاروکردەوەی ئێوەم بە تەواوی چوار دەوری کردەوەی ئێوەم داوە هیچ شتێك لە من ون نابێ.

با ئارام بگرین لەسەر ناخۆشیەکانی ژیان چونکە ڕێگاکەمان پێویستی بە ئارامگرتنە ئەگەر بەراستەقینە باوەڕمان هێناوە لە ماڵەکەی خۆمانەوە دەست پێ بکەین و هەر لەسەرەتاوە پێویستمان بە ئارامگرتنێکی ڕاستەقینە هەیە هەتا کۆتای ئەگەینەوە بە الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ هەتا ئەمان خەنە قەبرەکەوە هەتا تەمەنمان کۆتای پێ دێت پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە چونکە دونیا شوێن مانەوە نیە دنیا مەقەر نیە بەڵکو مەمەڕە دنیا ڕێگایەکە دەبێ جێ بهێڵین دەبێ بڕۆین ئێمە ڕێبوارین، کە تێگەیشتین ئێمە ڕێبوارین ئەوکاتە دەبێ تێشو بۆ قیامەتمان کۆ بکەینەوە.

رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرموێت: **(الصبر ضياء)** ئارامگرتن لەسەر نارەحەتیەکانی ڕێگا لەسەر تاقیکردنەوەکانی الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ ڕووناکیە

بەختەوەرییە و سەرفرازییە، هەندێکمان بە نەخۆشی تاقی دەکرێینەوە دەبێ سەبرِ بگرین ئەبێ شکورانە بژێربین ئەبێ دڵمان پەیوەست بکەین بە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ وە نابێ سەیری چواردەوری خۆمان بکەین بڵێین بۆ فڵانە کەس ساغە بۆ فڵانە کەس وانیە هەندێکی ترمان بە فەقیری تاقی دەکرێینەوە نابێت سەیری بینا بەرزەکانی چواردەورمان بکەین بۆ فڵانە کەس دەوڵەمەندە من فەقیرم الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ هەریەکەمان بە شتێك تاقی دەکاتەوە تاقی کردنەوەکەی تۆ زۆر ئاسانە کە فەقیریت بەڵام تاقی کردنەوەکەی خاوەن بینا بەرزەکە زۆر سەختە چونکە ناتوانێ زاڵ بێ بەسەر شەهەواتەکانی. کەوا بوو مرۆڤی موسڵمان کاتێ تاقی کرایەوە بەهەر شتێك لە یەکێك لە قوناغەکانی ژیانیدا ئەبێ ئارام بگرێ ئەنجامەکەی ڕۆشنە ئەنجامەکەی ئاسوودەی و بەختەوەرییە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ (السجدة) ئێمە پێشەنگەکانی خۆمان تاقی دەکەینەوە پێغەمبەران و خواناسان تاقی دەکەینەوە ساڵحین تاقی دەکەینەوە ئەوانەی کە ڕێگەی ڕاستیان گردووە تاقی دەکەینەوە ئەوانەی لەسەر حەقن تاقی دەکەینەوە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ئەوان دەرئەچن یەقینیان هەیە بە نیشانەکانمان.

رسول الله ﴿صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرموویت:( المؤمن الذي يخالط الناس, ويصبر على أذاهم خير من الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على أذاهم) ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵی خەڵك دەبێ و ئارام دەگرێت لەسەر نارەحەتیەکانی لەسەر بانگەوازی ئارام دەگرێت لەسەر ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە لەو بڕوادارە ئەجری زۆر زیاترە کە تێکەڵی خەڵك نابێ و ئارام ناگرێت لەسەر نارەحەتیان لەسەر ئازارەکانی ئەم ڕێگایەدا.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ (الفرقان) هەندێکتان بە هەندێکی ترتان تاقی دەکەینەوە ستەمکارێکی زاڵم دێت و موسڵمانان دەکوژێت موسڵمانان شەهید دەکات ئەمە تاقیکردنەوەی موسڵمانانە بەم ستەم کارە زاڵمە بەڵام الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿أَتَصْبِرُونَ ۗ﴾ ئارام بگرن چونکە ڕێگاکەی بەهەشتە ئارام بگرن چونکە ئەنجامەکەی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی الله یە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ﴿وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ خوای ئێوە ئاگای لێییە بینایە بەو زوڵم و ستەمە پێویستمان بە ثەبات هەیە لەسەر دینی خوا.

رسول الله ﴿صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرموویت: (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء، وإن الله إذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط) پاداشتە گەورەکان بۆ تاقیکردنەوە گەورەکانە ئەو کەسانەی تاقیکردنەوەی

گەورەیان بەسەردا دێت ئارام دەگرن پاداشتی گەورە وەردەگرن ئەگەر اللە﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ قەومێکی خۆش ویست تاقیان ئەکاتەوە هەر بەندەیەك رازیبوو بە تاقیکردنەوەکەی تەسلیم بوو ئەباتی هەبوو لەسەر خواناسین شوکرانە بژێر بوو اللە ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ لێی ڕازییە ئەگەر کەسانێکیش ڕووبەڕووی قەدەرکانی اللە ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ بووە وە ناشوکری کرد اللە ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ لێی تورە ئەبێ.

یەکێك لە ئەهلی فرعەون لە داروەدەستەی فرعەون وتی: ﴿قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ﴾ (الأعراف) ئێمە شوێنکەوتوانی موسا کوڕەکانیان ئەکوژین و کچەکانیان ئەهێڵینەوە ئێمە دەسەڵات دارین بەسەریاندا شوێنکەوتوانی موسا غەمبار بوون بەو قسەیە دڵیان نارەحەت بوو بۆ وامان لێ دێت؟ بۆ کورەکانمان ئەکوژن و کچەکانمان ئەهێڵنەوە؟ موسا ﴿عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ﴾بە قەومەکەی وت: ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ١٢٨﴾ (الأعراف) پشت بەخوا ببەستن و ئارام بگرن اللە ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ کێی بیەوێت لەسەر زەوی ئەیهێڵێتەوە ئاقیبەت بۆ بڕوادارانە دونیا شوێنی مانەوە نیە.

الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾﴾ (النساء) هیچ کاتێك بێ تاقەت مەبن لە نارەحەتیەکانی ژیان کە بەسەرتاندا دێت کە ئەبینن کافر و مل هوڕەکان ڕووبەڕووتان ئەبنەوە دڵنیا بن ئەگەر ئێوە ئازار و نارەحەتیتان بەسەردا بێت ئەوانیش هەمان شتیان بەسەردا دێت. الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ دەفەرموویت: ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ﴾ ئێوە ئومێدتان بە الله یە ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ ئەوان هیچ ئومێدێکیان بە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ نیە. کەوابوو ئێمە لەسەر ئازارەکانی ژیان توشی ئەجر و پاداشت ئەبین ئەوان بێ ئەجر و پاداشتن بەڵکو سزایش ئەدرێن نارەحەت ئەکرێن جەهەنمیان بۆ هەیە ئێمە ڕەزامەندی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ بەدەست ئەهێنین ئێمە بۆ تاقیکردنەوە هاتوین ئێمە لەم ژیانەدا بۆ ئەوە درووست نەکراوین بخۆین و بخۆینەوە بۆ ئەوە درووست نەکراوین شەهەواتمان تێربکەین بۆ ئەوە درووست نەکراوین بینا بەرز کەینەوە. بۆ ئەوە درووست کراوین کردووەی چاکە بکەین خواناسی ڕاستەقینە بکەین شیرك ئەنجام نەدەین. کێ زەمانی چەند ساتێکی کەمی ئێمە دەکات دوای هاتنە دەرەوەمان لە مزگەوت؟ ئەی کێ بە ئێمەی وت لەبرسا ئەمرن پەنا بەرین بۆ حەرام و خراپەکاری. ئەی الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ نافەرموویت: ﴿وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ (الذاريات) ئەمە

بەڵێنی الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ ڕزقی ئێوە لە ئاسمانە ئەی الله ﴿جَلَّجَلَالُهُ﴾ پێی نەوتون خواناسی بکەن دینداری بکەن قەبرەکتان ڕوون بکەنەوە قیامەتان ڕووناك بکەنەوە ژیانتان ڕووناك بکەنەوە بە ئیسلامەتی و خواناسی و دینداری، با هەوڵبدەین ئارامبگرین لەسەر ئازارەکانی ڕێگا هەوڵبدەین بەراستی دینی خوای پەروەردگار سەربخەین.



لە کۆتایدا داواکارم لە الله ﴿جَلَّ جَلَالُهُ﴾ لێمان خۆش بێ ڕەحمان پێ بکات ئاقیبەتمان خێر بکات لە دایک و باوکمان خۆش بێ شیفای نەخۆشی موسڵمانان بدا، یارەب موسڵمانان لە هەر شوێنکی جیهاندا ئازارێکیان هەیە لەسەریان لای بەری، سەریان بخەیت، یارەب هەرکەسێک دۆستە بە دینمان بە ڕەوشتمان بە نیشتمانی موسڵمانان خوایە پشتی بگری خوایە هەرکەسێک پێچەوانەکەیەتی یارەب پشتی بدەی بە زەویدا.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم

الحمد لله